# ناسنامەی نامیلکە

ناوی نامیلکە : 20 پرسیار لەلایەن منداڵان وەڵام
لە پێغەمبەری خوا ﷺ
ئامادەکردنی : سالار عومەر
وشە چاککردن : دایکی ڕێزدار
دیزاینی ناوەوە : ڕێدار عومەر
دیزاینی بەرگ : ڕێدار عومەر
تیراژ : 2500 دانە
ژمارەی سپاردن : ( 145 ) ساڵی 2022ز پێدراوە




بەرهەمی پەروەردەیی پڕۆژەی ئاگا بۆ منداڵان......(1)

پێشەکی :

بسم الله الرحمن الرحيم

پێش ئەوەی بچینە ناو فەرموودەکان پێویستە منداڵەخۆشەویستەکان دوو شت بزانن:

یەکەم : خودا کێیە؟

دووەم : پێغەمبەران کێیە؟

وەڵامی یەکەم : خودا کێیە:

خودا ئەو زاتەیە کە هەموو بوونەوەری دروست کردووە و خاوەنی هەموو بوونەوەرە،وە ژیان و مردن و ڕزق و ڕۆزیمان و ...تاد ،هەمووی بەدەستی خۆیەتی. خودا تاکە و هیچ هاوەڵێکی نییە،نامرێت و ناخوات و ناخواتەوە و ناخەوێ،وەچەندنین سیفەتی تری هەیە کە هیچ توانا و دەسەڵاتێک نییەتی،تەنها خۆی نەبێت.

وەڵامی دووەم : پێغەمبەران کێیە ؟

پێغەمبەران ئەو مرۆڤە پاک و چاک و ڕەوشت جوان و ڕاستگۆیانەن،کە خودای گەورە هەڵی بژاردوون بۆ گەلەکانیان تا پەیامی خودا بەگەلەکانیان بگەیەنن. پێغەمبەری ئێمەش محمد دوا پێغەمبەرە کە خودای گەورە ناردوێتی بۆ هەموو جیهان،وە لەسەر هەمووومان پێویستە بڕوای پێ بهێنین و گوێڕایەڵی ووتەکانی بکەین و خۆشمان بوێت.

پرسیاری یەکەم : منداڵان دەپرسن :

ئیسلام لەسەر چی بنیادنراوە ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ ؟

وەڵامی پێغەمبەری خودا ﷺ :- { بُنِيَ الْإِسْلَامُ عَلَى خَمْسٍ : شَهَادَةِ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ، وَإِقَامِ الصَّلَاةِ، وَإِيتَاءِ الزَّكَاةِ، وَالْحَجِّ، وَصَوْمِ رَمَضَانَ }.

واتە :- ئیسلام لەسەر پێنج شت بنیات نراوە: شایەتیدان بەوەی کە هیچ خوایەک نییە شایستەی پەرستن بێت جگەلە الله،وەمحمد ﷺ نێردراوی خودایە،نوێژکردن،زەکاتدان،حەجی ماڵی خودا،ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان .



منداڵان دەڵێن:
کەواتە ئێمەش **بڕوامان** پێی هەیە و جێ بە جێی دەکەین

پرسیاری دووەم : منداڵان دەپرسن :
ئیمان چییە ئەی پێغەمبەری خوداﷺ ؟
وەڵامی پێغەمبەری خوداﷺ :-

أَنْ تُؤْمِـنَ بِاَللَّـهِ وَمَلَائِكَتِـهِ وَكُتُبِـهِ وَرُسُـلِهِ وَالْيَـوْمِ الْآخِـرِ، وَتُؤْمِـنَ بِالْقَدَرِ خَيْرِهِ وَشَرِّه.

واتە: باوارِ بێنیت بە خوا و فریشتەکانی و کتێبەکانی و پێغەمبەرەکانی و ڕۆژی دوایی ، وە باوەڕ بێنیت بە قەدەر خێر و شەڕی .



منداڵان دەڵێن:
کەواتە ئێمەش
ئیمان دەهێنین

پرسیاری سێ یەم : منداڵان دەپرسن :
چاکەکار(احسان) چییە ئەی پێغەمبەری خوداﷺ؟
وەڵامی پێغەمبەری خوداﷺ:-
أَنْ تَعْبُدَ اللَّهَ كَأَنَّك تَرَاهُ، فَإِنْ لَمْ تَكُنْ تَرَاهُ فَإِنَّهُ يَرَاك
واتە: بریتییە لەوەی کە خوا بپەرستیت وەکو ئەوەی کە ببیینیت ، وە ئەگەر تۆ خوا نەبینیت ئەوا ئەو تۆ دەبینێت



منداڵان دەڵێن:
کەواتە ئێمەش
چاکەکار دەبین

**پرسیاری چوارەم : منداڵان دەپرسن :**

**نزیکترین کات چ کاتێکە تا لەخوداوە نزیک بین ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ؟**

**- وەڵامی پێغەمبەری خودا ﷺ :-**

{أَقْرَبُ ما يَكونُ العَبْدُ مِن رَبِّهِ، وهو ساجِدٌ، فأكْثِرُوا الدُّعاءَ}

**واتە:- نزیکترین کات کە مرۆڤ لەخواوە نزیک بێت لەکاتی سوجدە بردن دایە،بۆیە زۆر تێیدا دوعا بکەن.**



**منداڵان دەڵێن:**

**کەواتە ئێمەش سوجدە دەبەین و نزا لە خوای گەورە دەکەین**

پرسیاری پێنجەم : منداڵان دەپرسن :
گەورەترین تاوان چییە ئەی پێغەمبەری خوداﷺ؟
وەڵامی پێغەمبەری خوداﷺ :-
{ اكبر الكبائر، الشِّرْكُ باللَّهِ،...}
واتە:-گەورەترینی تاوانە گەورەکان:
هاوبەش بڕیاردانە .



منداڵان دەڵێن:
کەواتە هاوبەشی بۆ خوا
بڕیار نادەین و خۆمان دەپارێزین
لەو تاوانە گەورەیە

پرسیاری شەشەم : منداڵان دەپرسن :
کێ لەهەموو کەس ئیمانی تەواوترە ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ؟
وەڵامی پێغەمبەری خودا ﷺ :-
{ أَكْمَلُ الْمُؤْمِنِينَ إِيمَانًا أَحْسَنُهُمْ خُلُقًا }
واتە:- ئەو کەسەی لەهەموو کەس ئیمانی تەواوترە ئەوەیانە کەلە هەموویان زیاتر ڕەوشت جوانترە.



منداڵان دەڵێن:
کەواتە کردەوەکانمان
بە جوانترین **ڕەوشت**
دەڕازێنینەوە



پرسیاری حەفتەم : منداڵان دەپرسن :
چۆن مامەڵە لەگەڵ خەڵکیدا بکەین ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ ؟
وەڵامی پێغەمبەری خودا ﷺ :-
{وخالِق الناسَ بخُلُق حَسَن }
واتە:-وە مَامەڵە لەگەڵ خەڵکیدابکە بەڕەوشتی جوان.



منداڵان دەڵێن:
کەواتە بە جوانترین ڕەوشت لەگەڵ خەڵکیدا مامەڵە دەکەین

پرسیاری هەشتەم : منداڵان دەپرسن :
پێش دەست پێکردن بە نان خواردن چی بڵێین ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ؟
وەڵامی پێغەمبەری خوداﷺ:-
{فإذا أكَلَ أحدُكُم طعامًا فليقُل بِسمِ اللَّهِ فإن نَسِيَ أن يقولَ بسمِ اللَّهِ في أوَّلِهِ فليقُلْ بسمِ اللَّهِ في أوَّلِهِ وآخرِهِ}
واتە :- ئەگەر یەکێ لەئێوە خواردنێکی خوار دبا بڵێت : بِسمِ اللَّهِ،ئەگەر بیری چوو لەسەرەتادا بِسمِ اللَّهِ بکات ئەوا بابڵێت : بسمِ اللَّهِ في أوَّلِهِ وآخرِهِ ( بەناوی خوا لەسەرەتا و لەکۆتاییەوە ).



منداڵان دەڵێن:
کەواتە پێش ئەوەی دەست بەخواردن بکەین بسمِ اللَّهِ دەکەین

پرسیاری نۆیەم : منداڵان دەپرسن :
لەکاتی یاریکردندا چ شتێک خراپە تا نەیکەین ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ ؟
وەڵامی پێغەمبەری خودا ﷺ :-

{ ولا تَضْرِبُوا المسلمينَ}

واتە :- وە لە موسڵمانان مەدەن .



منداڵان دەڵێن:
کەواتە نابێ لەکاتی یاریکردندا هاروهاجی بکەین و شەڕ بکەین و یەکتر ئازار بدەین

پرسیاری دەیەم : منداڵان دەپرسن :
خـودای گـەورە ڕقـی لـەچ کردەوەیەکـە تـا نەیکەین ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ؟
وەڵامی پێغەمبەری خودا ﷺ :-
{ إنَّ اللهَ تعالى يُبغِضُ الفاحِشَ المُتفَحِّشَ }
واتـە :- بەڕاسـتی خـوای گـەورە ڕقـی لەجوێـن فرۆش و قسەی ناشرینە.



منداڵان دەڵێن:
کەواتە جنێو نادەین و قسەی خراپ ناکەین،تا خوای گەورە بەردەوام ئێمەی خۆش بوێت

**پرسیاری یازدە : منداڵان دەپرسن :**

**ڕەوشتی ئیسلام چییە ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ؟**

**وەڵامی پێغەمبەری خودا ﷺ:-**

{ إنَّ لِكُلِّ دينٍ خُلُقًا، وإنَّ خُلُقَ الإسلامِ الحياءُ }

**واتە :- هەموو دینێك ڕەوشتی خۆی هەیە،وە ڕەوشتی ئیسلامیش شەرم کردنە.**



**منداڵان دەڵێن:**

**کەواتە ئێمەش ئەو ڕەوشتە جوانە پەیڕەو دەکەین**

پرسیاری دوازده : منداڵان دەپرسن :

چ شتێک پیسە تا خۆمان بپارێزین ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ؟

وەڵامی پێغەمبەری خودا ﷺ:-

{ تنزَّهوا مِنَ البَولِ }

واتە: خۆتان بەپاک ڕابگرن لە میز.



منداڵان دەڵێن:

کەواتە ئێمەش خۆمان

بە پاکی ڕادەگرین.

پرسیاری سێزدەم : منداڵان دەپرسن :
باشترین کردەوە چییە ئەی پێغەمبەری خوداﷺ؟
وەڵامی پێغەمبەری خوداﷺ :-
{ أفضلُ الأعمالِ : الصَّلاةُ لوقتِها ...}
واتە : باشترین کردەوە : نوێژکردنە لەکاتی خۆیدا



منداڵان دەڵێن:
کەواتە نوێژەکان لە کاتی خۆیان ئەنجام دەدەین

پرسیاری چواردە : منداڵان دەپرسن :
چـۆن بتوانیـن ماڵێـك لەبەهەشـت بەدەسـت بهێنیـن
ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ؟
وەڵامی پێغەمبەری خودا ﷺ :-
{ مـن قـرأ ( قُـلْ هُـوَ اللـهُ أَحَـدُ )عـشرَ مـراتٍ بـنى اللهُ لـه بيتًـا في الجنَّةِ}.
واتـە:- هەرکەسێک دە جـار قُـلْ هُـوَ اللهُ أَحَـدُ بخوێنـێ ئـەوا خوای گەورە ماڵێکی
لەبەهەشتدا بۆ دروست دەکات .



منداڵان دەڵێن:
کەواتە ئێمەش
گوێڕایەڵ دەبین

پرسیاری پازده : منداڵان دەپرسن :
دەتوانین یەکتر بترسێنین ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ؟

وەڵامی پێغەمبەری خودا ﷺ:-

{ لا يحلُّ لمسلمٍ أن يروِّعَ مسلمًا }.

واتە:- حەڵاڵ نییە بۆ موسڵمان کە موسڵمان بترسێنێت.



منداڵان دەڵێن:
کەواتە یەکتر
ناترسێنین

پرسیاری شازده : منداڵان دەپرسن :

ستەم کردن دروستە ئەی پێغەمبەری خوداﷺ؟

وەڵامی پێغەمبەری خوداﷺ :-

{ اتَّقُوا الظُّلْمَ ؛ فإنَّ الظُّلْمَ ظُلُماتٌ يومَ القيامةِ }.

واتە:-خۆتان لەستەم بپارێزن ،چونکە ستەم کردن تاریکییە لەڕۆژی قیامەتدا.



منداڵان دەڵێن:

کەواتە ستەم

لە یەکتر ناکەین

پرسیاری حەڤدە : منداڵان دەپرسن :
چـۆن بەئاسـانترین شـێوە خێروچاکـە بەدەسـت بهێنیـن ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ؟
وەڵامی پێغەمبەری خودا ﷺ:-
{ تَبَسُّمُكَ فِي وَجْهِ أَخِيكَ صَدَقَةٌ }.
واتە :- بە زەردەخەنە کردنت بۆ برا و هاوەڵەکەت ، خێر و چاکەت بۆ دەنوسرێ.



منداڵان دەڵێن:
کەواتە ئێمەش
گوێڕایەڵی دەکەین

پرسیاری هەژدە : مندالان دەپرسن :
چۆن بەهەشت بەدەست دێنین ئەی
پێغەمبەری خودا ﷺ ؟
وەڵامی پێغەمبەری خودا ﷺ :-
{ مَنْ قَالَ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، مُخْلِصًا، دَخَلَ الْجَنَّةَ}.
واتە:- هەر کەس لە ناخەوە بڵێ: (لا إله إلا الله)
دەچێتە بەهەشتەوە.



مندالان دەڵێن:
کەواتە ئێمەش
گوێڕایەڵی دەکەین

پرسیاری نۆزده : منداڵان دەپرسن :
ماڵی بڕواداران کوێیە
ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ؟
وەڵامی پێغەمبەری خودا ﷺ: -
{الْمَسْجِدُ بَيْتُ كُلِّ مُؤْمِنٍ }.
واتە :- مزگەوت ماڵی هەموو بڕوادارێکە.



منداڵان دەڵێن:
کەواتە ئێمەش دەڕۆین بۆ
ماڵی بڕواداران.

پرسیاری بیست : منداڵان دەپرسن :
لەگەڵ دراوسێکان چۆن بین
ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ؟
وەڵامی پێغەمبەری خودا ﷺ :-
{ أَحْسِنْ إِلَى جَارِكَ تَكُنْ مُؤْمِناً }.
لەگەڵ دراوسێکەت چاکەکار بە،
دەبیت بە بڕوادارێکی (تەواو).



منداڵان دەڵێن:
کەواتە ئێمەش لەگەڵ
دراوسێکانمان چاکەکار
دەبین

پرسیاری بیست و یەک : منداڵان دەپرسن : قورئـان بـۆ چـی هاتـووە ئـەی پێغەمبـەری خودا ﷺ ؟

وەڵامی پێغەمبەری خودا ﷺ :-

{ اِقْـرَؤُوا القُرْآنَ وَاعْمَلُوا بِهِ }.

واتە :- قورئان بخوێنن و، کاری پێبکەن.



منداڵان دەڵێن:

کەواتە ئێمەش قورئان دەکەینە ڕابەرمان.